شیعر

لە چاپکراوەکانی ئەمیندارێتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان

زنجیرە «٧»




# دیوانی ئەخۆڵ

هۆنراوەی

ئەحمەد دەروێش عەبدوڵڵا

چاپی یەکەم ○ ساڵی ١٩٨٤

لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی ی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان
زنجیرە « ٧ »

# دیوانی ئەخۆڵ



هۆنراوەی
ئەحمەد دەروێش عەبدوڵڵا



سلێمانی – ١٩٨٣



## پێشەکی :-

لەسەر داخوازی زۆر کەس لەمەوپێش و ئێستا ئەم کورتە باسە دەربارەی ژیان و بەسەرهاتی خۆمەوە بنووسم .

١ -

ناوم (ئەحمەد) باوکم (دەروێش) باپیرم (عەبدوڵڵا)یە ، ناوبانگم (ئەخۆڵە) ، لەساڵی ١٩١١ز لەشاری سلێمانی لەگەڕەکی (دەرگەزێن) لە ناوچەی سەرگوڵ هاتوومەتە دنیاوە ، کە لەدایك بووم بە ساوایی باوکم و دایکم و خێزانەکەمان لەجیاتی ئەحمەد پێیان وتووم «ئەحۆڵ» وەهەر لەو کاتەدا ئامۆزایەکم بووە زمانی گرتووە ، بەڵام زمانی باش نەپژاوە نەیتوانیوە بڵێ (ئەحۆڵ) پێی وتووم (ئەخۆڵ) ئیتر لەوکاتەوە لەناو خێزان و خزمان و گەڕەکدا هەر بە ئەخۆڵ ناویان بردووم هەتا ئێستا .

٢ -

### پلەی خوێندەواریم

پایەی خوێندەواریم بەداخەوە زۆر کەمە چونکە ئەوکاتەی من گەیشتوومە تەمەنی خوێندن پاش جەنگی یەکەمی جیهانی بوو ، وەگرانی و پەشێوی لە سلێمانی دا هەبوو وە قوتابخانەش نەبوو لەلای مامۆستایەکی ناوخۆیی . حوجرە هەبوو توانیم قورئانی پیرۆز بخوێنم ئینجا کە لەشکری ئینگلیز هاتە سلێمانیەوە قوتابخانەیەك بەناوی (نموونەی سەعادەت) کرایەوە ، چوومە ئەو قوتابخانەیە لەوێ مامەوە تا پۆلی یەکەم تەواوکرد . ئینجا شۆرشی شێخ مەحموود بۆمبارانی بەسەردا هات و قوتابخانەکە نەما . هەتا شێخ مەحموود حوکمی کەوتەوە دەست ، ئەوکاتە دوو قوتابخانە کرایەوە ، یەکێکیان بەناوی (مەحموودی) ئەوی تریان بەناوی (قادری) . من چومە قوتابخانەی قادری هەتا گەیشتمە پۆلی سێ دیسان سلێمانی کەوتەوە ژێر بۆمبارانێکی زۆرەوە قوتابخانە نەما خۆیشم ماوەیەك چووم بۆ بەغداد کەهاتمەوە لە پۆلی سێ وە دەستم پێکردەوە هەتا چوومە پۆلی پێنجەم ، لەپێش نیوەی ساڵدا لەبەر هۆیەك کە نابێ لێرەدا باسی بکەم . وازم لەخوێندن هێنا . وە هێشتا لە تەمەنی منداڵی دا بووم هەوڵمدا بۆ ئیش کردن تا لە ڕۆژی ١٩٢٩/٩/٢ لە چاپخانەی شارەوانی لە سلێمانی کە ئەوکاتە ڕۆژنامەی (ژین و

ژیانی) دەرئەکرد ، چوار ساڵو نیو لەوێ مامەوە هەتا ١٩٣٤/٣/٣١ . کە چاپخانەکە داخرا هەر لەو ساڵەدا بووم بە نووسەر لەدادگا هەتا ساڵی ١٩٧٠ خانەنشین بووم .

بەڵام بەڕاستی ئەو ماوەیەی کە لە چاپخانەکەدا ئیشم ئەکرد زۆرم پێخۆش‌بوو وە ئەو ماوەیە (پیرەمیرد)ی نەمر هەرچەند کاربەدەست‌و لێپرسراوم‌بوو بەڵام ئەرکی دەرهێنانی ئەو دوو ڕۆژنامەیەی زۆر لەسەر شان‌بوو بەتایبەتی هەر لەو ماوەیەدا بوو کە (پەندی پێشینان)وە (ڕۆحی مەولەوی) وە زۆر هۆنراوەو نووسینی تری بەنرخ لە ڕۆژنامەکان‌دا بلاوئەکردەوە لەوە سوودم وەرگرت ، جگە لەوەش هۆنراوەو نووسینی زۆر ئەهات بۆ

چاپخانەکە نەك هەر لەناو عیراق بەڵکو لەزۆر شوێنی دەرەوەی عیراق‌دا هۆنراوەو پەخشان‌و نووسراوی تریش ئەهات هەمووی ئەخوێندەوە جگە لەمانەش پەیوەندیم هەبوو بە بنەماڵەیەکی شێخانی ناوچەی بیارەوە کە لەم بنەماڵەیەدا شاعیرو نووسەری لێ‌هەڵکەوتبوو وەکو مامۆستا موحەممەد عەلی (مەدهۆش) لە دیوانی (یانەی دڵان)دا باسی کردووە لەو بنەماڵەیە من‌و (کامەران موکری) واتا موحەممەد ئەحمەد تەها کە برامەو خاڵی جوانەمەرگم (مەلا سەعدی) بەشداربووین .

ئینجا ئەو ماوەیەی کە لە چاپخانە بووم ئەمانە هانیان دام وەکو هەوێنێك چووە خوێنمەوە کە بتوانم هەندێ هۆنراوە پێشکەش بکەم هەر بەو هۆیەوە زۆر لە شاعیرانی هاوچەرخ ، زۆریانم ناسی ، بەڵام زۆرتری کۆبوونەوە لە کۆری شیعردا لەگەڵ هەندێ لە شاعیرو نووسەردا وەکو (شێخ نووری شێخ ساڵح ، فایەق بێکەس ، شێخ سەلام ، گۆران ، ئیبراهیم ئەحمەد ، ڕەمزی قەزاز) بووە .

وەهەر لەو کاتەشەوە توانیم بەشداری ڕۆژنامەی (ژین ، ژیان ، گۆڤاری گەلاوێژ ، ڕۆژی نوێ) بکەم ، تا لە ساڵی (١٩٧٠) یەکەم دیوانم پێشکەش‌کرد بەناوی (پەیمان‌و شیوەن)ەوە بلاوکرایەوە .

٣ -

خۆم دانی پیا ئەنێم کە هەندێ لەو هۆنراوانە کە لە ساڵانی ١٩٣٠ بەرەو ژوورتر نووسیومە ئێستەش شێوەی هاوچەرخ‌و پێش هاوچەرخمە . بۆ نموونە هەندێکیان

وەکو (مەحوی ، نالی ، حەمدی ، کەمالی ، سەلام ، بێکەس ، شێخ نووری)و زۆری تر بەم شێوەیە هۆنراوەیان داناوە ، نەك هەر بەهونەر بەڵکو بە هونەرێکی گەورە دانراوە کەوا هۆنراوەکانی‌یان تێکەڵن لە ووشەی عەرەبی‌و فارسی‌و هەتا تورکیش .

ئینجا ئەگەر کەم‌وکووڕی تێدابێت منیش پەیڕەوی ئەوانم کردووە ، وە هیوام وایە خوێنەرانیش بەو چاوەوە سەیری بکەن ئەگەر ناتەواوی‌یەکیشی تێدابێت چاوپۆشی لێ‌بکەن‌و . بەدڵێکی فراوانەوە ئامادەم بۆ ڕەخنەو لێکۆڵینەوە . ئیتر سوپاس . . .

● ئەخۆڵ ●



# (سکالاّ لەگەڵ بلبل‌دا بە دڵێکی پڕ لە سەوداوە) (١)

بەهارە بلبل ، . . . بلبل بەهارە
سەرەتای ناڵەی سەودایی زارە
وەرە بناڵین بەجووت لەشەودا
ئێمە شەو بێدار بێ‌خەم لەخەودا
وا بەری بەیان سفیدەی نواند
تەمو تاریکی لەگوڵشەن ڕەواند
دەشت‌و کێو هەمووی بەگوڵ خەمڵیوە
بەرگی بووکێنی تازەی پۆشیوە
هەوری بەهاری لەگەردو خول‌دا
چیمەن گەردانەی شەونم لەمل‌دا
لاگیرەی زێرە قەتارەی گوڵزار
هەیاسەی پشتە زنجیرەی ڕوبار
بەڕەزا پرچی پەخشان کردووە
شنەی بای شەماڵ شانەی کردووە
نێرگس بە پەنجەی یادی لێلاخان
ڕووپۆشی لادا سەرمەستو خەندان
پەڕەندەش لەسەر لق درەختان
هەریەك ئاوازێ ئەڵێن بۆ بەیان
پۆڕ بەگەناسەو قومری بە ئاواز
بوون بەدوو یاری هاودەمو هاوراز

---

تێبینی :

(١) ئەم هۆنراوەیە ، یەکەم هۆنراوەمە کە لەژێر ناوی (بێ‌نەوا) لەساڵی ١٩٣٣ لە ڕۆژنامەی (ژیانی) ژمارە (٣٥٧) لە ڕۆژی ١٦ی مارت‌دا بلاوکراوەتەوە وا ئێمەش بەبێ دەس‌کاری بلاومان کردەوە .

کەو بە قاسپە قاسپ کۆتر بەهاق هاق
لەدڵ دەرئەکەن مەینەتو فیراق
جریوەی چۆلەکەو شەقەی باڵی مەل
وەك مۆسیقایە لەمکەل بۆ ئەوکەل
قوقەی کەڵەشێر دەنگی بانگدەران
لەئەرز تێپەڕین گەیین بە ئاسمان
ئاسمانیش ئەوا چاو ئەکاتەوە
دنیای پڕ لەتەم ڕوون ئەکاتەوە
وەرە منو تۆیش هاوڕازو هاودڵ
من شێتی پەرچەم تۆ شەیدای ڕووی گوڵ
تۆ بڕۆ سەرچڵ من لەپای کۆهسار
خوڕ خوڕ بڕێژین فرمێسکی خونبار
تێروپڕ بگرین یەك دەنگو ئاواز
تا واخول ئەدا گەردوونی کەچباز
هەتا پاڵ ئەدەین بەلای مەرگەوە
بەشوێن زامانی دڵو جەرگەوە
تاکو ئەچینە باوەش دایکی خاك
بە ئاهی سەردو بەدڵی خەمناك
بپارێنەوە لای تاکە خوامان
بەڵکو بێتەبەر گوڵی هیوامان



# (بەرەو ڕووناکی)

**وەرگیراوە**

لە ناخی جەرگی تاریکییەوە
لە کانگای دیلیو هەژارییەوە
دەس لە کەلەپچەو زنجیر لەپێما
تەوق نەزانی وا لە گەردنما
کەوتوومەتە ڕێ ڕێگەی بێباکی
هاتوومو ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی
پشت بە جەزرەبەی قامچی دارزاو
چاو ، ناوچەوان تف پیایا هەڵپژاو
بەشەلیو قاچی دارکاری کراو ،
فرمێسك لەچاوما وشكو قەتیس ماو
پێستی لەش بەسەر ئێسکا نووساوە
بەدڵێك وەکو پۆڵای ئاودراوە
ڕێم گرتۆتە بەر زۆر بە چالاکی
ئەڕۆمو ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی
هەرچەند ماندوومو ڕێگام دوورەو دێر
برسیەو ڕووتم ، دوژمن پۆشتەو تێر
من پێ ودەس بەسراو بێ هێزو توانا
دوژمن بەهێزەو دەستی بەرەڵلا
لەگەڵ ئەوەشا بە هەستێکی بەرز
ویستێکی نەگۆڕ ، گیانێکی نەبەز
ئەڕۆم بە مەردیو زاتی بێباکی
ئەڕۆم بێوچان بەرەو ڕووناکی
ئەزانم ڕێگام سەختەو پڕ ئازار
پڕ لە دوژمنی خوێنەخۆو زۆردار

بەچەن کۆسپو ئەرك ڕێگام تەنراوە
بۆ ئەوەی نەڕۆم نەکشێمە دواوە
بەڵام نە سەختی ڕێی پڕ ئەرکو دوور
نە تاریکای سامی بێ سنوور . . .
نەزۆری زۆردار نەزۆری دوژمن
داناخورپێنێ تۆزێ دڵی من
سەرەو هێناومە . . . سەری بێباکی
ئەڕۆم بەبێ ترس بەرەو ڕووناکی

* * * * * * * * *

ئەزانم کەوا دوژمنەکانم
زۆر بلیمەتن بۆ ئازاردانم
بەڵام ئەوداخەم وا لەبەر چاوە
کە بەڕووی باوکو باپیرمیان ناوە
ئەزانم کەچەن جەربەزەو زوشتن
بۆ گیان فڕاندن بۆ ویژدان کوشتن
بەڵام لەهەموو زامێك ناسۆرتر
لە بەندیخانەی دوژمن تاریکتر
دڵو ژیانی پەستی ئێستەمە
کەپڕ لەتاڵیو ژانو ستەمە
بۆیە هێز نیە کەبم وەستێنێ
دەسەڵات نیە بم سڵەمێنێ
ئەوا بەگورجیو چوستو چالاکی
ڕۆییمو ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی

* * * * * * * * *

ئەزانم ڕەنگە نەشگەم بە ئاوات
لەیەکەم قۆناغ دوژمن لێم بدات
یان ڕێی تێئەچێ خۆم لەپڕ بمرم
لەگەڵ ئەمانەش ڕێبەو ئەیگرم

چونکە مەردنم ڕووەو ڕووناکی
چاکترە لە (مان) ژین بە تاریکی
بۆیە هەر ئەڕۆم زۆر بە دڵپاکی
بەرەو ڕووناکی بەرەو ڕووناکی

* * * * * * * *

نەء . . نەء . . من خۆم‌نیم بەتاق تەنیا
ڕێ بگرمەبەر ، بێ‌ترس دڵنیا
بەڵکو هەزاران هەزار هەژارین
بۆ یەك هۆ هەموو ئامادەی کارین
بۆ کەرامەتی پێ‌شێل کراومان
پێستی پشت بەدار فڕێ دراومان

●

ئابرووی هەموو تکێنراومان
مافی هەزاران ساڵی خوراومان
ویژدانی گشتی توێنراومان
گیانی بەدیلی فڕێنراومان
ئەو زوڵم‌و زۆرەی کراوە لێمان
چە لەخۆمان‌و باوو باپیرمان
دەردی نەزانی‌و هۆی هەژاریمان
بوونەتە هێزی دڵ‌و وورەمان

●

هەستاوەتەوە هاتونەتە ژان
تێیان ئەخوڕن ، بانگ ئەکەن لێمان
گشت ئەنەڕێن وا بەسەرمانا
بەسەر منا نا . . . هی هەموومانا
بڕۆین بەیەکجار زۆر بە چالاکی
هەموو بەجارێك بەرەو ڕووناکی

بەرەو ڕووناکی ئەڕۆین بێگومان
هەر بە کوێرایی چاوی دوژمنان
سەرەڕای سەختیو مەترسی ڕێوبان
هەتا بەئاوات ئەگەین هەمومان

---

تێبینی :
ئەم پارچە هۆنراوەیە لە ساڵی ١٩٧٣ لەپارچە پەخشانێکی وەرگێڕاوی مامۆستا
(أ.أ) وەرگیراوە .



## چوارینە

ساقی شێرزەم بەدەس دنیاوە
بەدەس مەینەتو جەورو جەفاوە
دەستم دامەنت خێراکە هەستە
بەجامێ هەمووی بخەینە لاوە

# ئەزانی من کێم ؟

**١٩٤٥**

کەچاوم کردەوە ڕوانیم بەدەوری خۆمو دنیادا
چلۆن خۆم دی لەلافاوو شەپۆلو گوژمی دەریادا ؟
چە لافاوێك سەراسەر پڕ لەناسۆرو لەناکامی
لەئەشکەنجەو کلۆلیو نەگبەتی پڕبوو لەسەرسامی
نەباوکێك بوو دەستم بگرێ بەڕێگەی ڕاستیا بمبا
لەژێر سایەی جگەر سۆزیو حەنانیدا بەخێوم کا
نەکۆشی گەرمی دایکێك وەکو دایکی هەڤالأنم . . !
کەتیایا بسرەوم ساتێك پشوویەك بێتە بەرگیانم
کەساسو بێنەوا هەردەم لەماڵی خۆمو خوێشانم
بەڵێ ئەژیام وەکو ئینسان بەلأم پڕ دڵبوو گریانم
لەڕوخسارو لەسیماما نیشانەی نەگبەتیو ماتەم
وەکو ڕۆژ ئاشکراو دیاربوو ئەگەرچی لێوبوو پڕ خەندەم
بەڵێ ئەو نوتفەیەی گیانی منی هێناوەتە بەرهەم
سەراسەر چینو بنچینە هەموو دەردەو پەژارەو خەم
وەها بەمجۆرە بوو ژینم لە ئاسۆیەکی ماتەمدا
نەهاتی یەك بەدووی یەكدا لە دنیایەکی پڕ خەمدا
ئەوا ئێستاش کە ئەمبینی کەوا زیندوومو هەرماوم
بەلأم مردم لەتاف لاوی یاو هێشتا نەنێژراوم



# شەماڵ

مەستبووم بە نەشئەی شیرین خەیاڵێ
ناگاه دای لە ڕووم کزەی شەماڵێ
بەڵام شەماڵ چی ؟ ؟ وەك ئاگر بەتین
هێنایەوە سوێ زامانی دێرین
وتم : بە شەمال ، شەماڵی ئازیز
جوانی بەهارو ماتەمی پایز
خۆ تۆ فێنکی ی دڵ زامارانی
یەکە هاورازی بەری بەیانی
ئێستا کە بۆچوا پڕ تین‌و تاوی ؟ ؟
وەك کڵپەی ئاگر پڕ لە هاڵاوی ؟
وتی : دوێنێشەو لەبەر بەیانا
لەوەختی ڕازی قومری‌و گوڵانا
ئەشنامەوە شێنەیی‌و سەربەست
لەشاخ‌و داخ‌و جێگای بەرزو پەست
ڕۆیم بەسەر چەن باخ‌و گوڵزارا
بەسەر چەن میرگ‌و چەن مێرغوزارا
گاهێ گوڵانم ئەگەشانەوە
تاوێ چڵانم ئەلەرانەوە
تێپەڕیم بەسەر کۆشك‌و تەلارا
بەسەر هێلانەی کپی دڵدارا
کاکوڵ‌و پەرچەم ئەشەکانەوە
ماندووی ڕێبوارم ئەحەسانەوە
بەشنەشن‌و سروەی ئەسپایی
گوڵ‌و گیام خستە هەڵپەرکێ‌و شایی
کاتێ سەیرم کرد لە بنەماڵێ
وا نەوجەوانێ گەردن پڕ خاڵێ
سەرتاپا ڕەشپۆش بە دەنگی نووساو

وا بەکوڵ ئەگری دڵ ئەکا بەناو
پرسیم ئەی جەوان چی‌یە ئەم حاڵە
بەم تەنهایی‌یە لەم بنەماڵە ؟ ؟
بەیەك هەناسەی شەرارە بزوێن
بەدوو دڵۆپی فرمێسك وەك خوێن
سەری هەڵبڕی‌و زۆر بەکەساسی
پرسی بەراستە تۆ من ناناسی ؟ ؟
وتی : وەتەنم بێ پشتیوانم
بێ جگەرسۆزو ڕۆڵەو باوانم
وا بێ‌ناز کەوتووم ئەگریم بۆ شادی
تا لەبەر ئەکرێم بەرگی ئازادی
ئەوەم دی شنەی خۆم نابەلاوە
شێوەی ئەوم گرت بەسەر دنیاوە

●

## چوارینە

ئەم خاکە پاکە هی‌تۆیەو هی من
تیایا رزیوە بەسەد جۆر مردن
ئێسك‌و پروسکی باو باپیرمان
نایدەین بەفیرۆو تاڵان بە دوژمن

# ڕۆژی ئاوا

ئەوا ئاوابوو ڕۆژی ئێستر ژینم لەدنیا چی
لەهاتو چۆو لەگریانو لە ناڵەی سوبحو شام چی ؟
کە کردم دیقەتی ئەبرۆی کەمانو تیری حازربوو
بەتیرێ سینەمی کونکرد لە ئامانو دەخیلم چی

* * * * * * * *

ئەوا کووشتوومی ئەو ماوە کەچی پێشم ئەڵێ ئەبلە
ئەوا ڕۆیم لەبەرچاوت لەپاش من عەیشو نۆشت چی
کەتۆ کووشتوومت قەد عەرعەر وە خوێنم تاقە ماچێکە
بدە ببڕێتەوە ئاخر مەڵێ هەوڵو کۆششت بۆ چی

* * * * * * * *

شەهیدم من ، کەساسم من لەدنیای ڕوون بەریم ئینجا
کەمن کوژراوی یارم بم لە جەوابی ڕەقیبم چی
ئەوا یەختم حەواڵەتکرد مەدەد یا (ئەحمەدی کاکی)
سەگی بەر قاپی تۆبم لە چوونی لای تەبیبم چی

* * * * * * * *

وەرە قابیز بکێشە ڕۆحی (ئەحمەد) با نەجاتی بێ ؟
لەڕۆژێ سەد کەڕەت کوشتن لەتۆ زیاتر پەناهم چی



# بۆ گیانی پاکی (فاضل حمە غریب)

**١٩٧٦**

سەیوان : مەڵبەندی هەزار پیرو جوان
ئەی دوا قۆناغی کاروانی ژیان
ئەمجارەت میوان لاوێکە نازدار
سەرچاوەی خولق بەرزو بایەخدار
ئەمجارەت میوان بەڕێزەو ئازیز
گوڵی وەریوی سەرەتای پاییز
لای کەس و کاری لەجێی چاوان بوو
چرای ناو کۆڕی برادەران بوو
هەمووی پێ جێهێشت چەرخی بێ ئەمان
هێنایان بۆتۆ ئەی گردی سەیوان
جاتۆش بنووسە بە پیتی نورین
زاخاو درابێ بە ئەشکی خوێنین
لەسەر گۆڕەکەی لەسەر بەردو گڵ
لەسەر ئەلحەدو لەسەر گوڵ و چڵ
کە ئەمە گۆڕی نەونەماڵێکە
لاوێ : تەمەنی نۆزدە ساڵێکە
بەری ژیانی هەر نەچەشتبوو
وەك خەوی شیرین هات و بەسەر چوو
ئینجا ڕاسپێرە فریشتەی خوایی
بیگرنە باوەش زۆر بە ئەسپایی
جێگەی بۆخۆش کەن لەناو بەهەشتا
لەخۆشترین جێی سەیران و گەشتا

لەجێی باوکی بن ، لەجێی دایکی بن
لەجێی برای بن ، لەجێی خوشکی بن
باوەشێنی کەن حۆرو غیلمانی
بیتە هاوسەری فریشتەکانی
بیلاوێننەوە جوانەو نازدارە
بەڵام وریای بن گیانی زامارە
با بەشێنەیی باوەشێنی کەن ؟
بە سرودی خوا خەمڕەوێنی کەن
دوا تکام وایەو مەمکە بێبەری
بنووسە لەسەر بەردی ژوور سەری
پەیمانێ (فاضل)هەتاکو ماوم
بۆتۆی تەرخان کەم فرمێسکی چاوم



---

تێبینی :
ئەم هۆنراوەیە بۆ گیانی پاکی فاضل غریب پێشکەش کراوە .

# «گلەیی»

هاتە سوێ دیسان برینم فیکری جارانت ئەکەم
هەر وەکو مەجنوون بەدائیم زیکری لەیلانت ئەکەم
جێگەی تیرێ کە لێت‌دام بوو بە ناسۆری برین
چاوەیەکی خوێنە ئێستاش عەرزی شوکرانت ئەکەم
هەردوو چاوم کوێربوو هێند گریام لەهیجرت بێڕەحم
هەر نەهاتی وەختە بمرم جان فیدای جانت ئەکەم
ئاخ لەکوێی ؟ توخوا ئەوا هەردوو گلێنەم دەرپەڕی ! !
هەر دەڵێم ئەمڕۆو سبەینێ خۆم بە قوربانت ئەکەم
ڕەنگە بێڕەحمو وەفا بێ زانەری حاڵم نەبێ !
وا لەخوێنا من ئەگەوزێم نەقڵی قورئانت ئەکەم
بۆ دەوای زەخمو برینم تۆزی خاکت مەڵهەمە
بێت‌و ڕابووری بەلاما عەبدی دامانت ئەکەم . . .

زەحمەتە تا ڕۆژی مەحشەر ناوی تۆ ونکەم لەدڵ
قەترە فرمێسکی بە جۆگەم خەڵتی سیروانت ئەکەم
مەشریق‌و مەغریب ئەگەر پڕکەن لە خونچەو دەستەگوڵ
هەروەکو بولبول لەیەك گوڵ شین‌و قەترانت ئەکەم
یەعنی کەعبەم بێتە بەردەست بەینی تۆ سەد ساڵ ببێ
بۆ تەوافی کەعبەکەت قەتعی بیابانت ئەکەم
بێت‌و بمری خوانەخواستە مەرگی من پێشت کەوێ
گەر هەزار ساڵ مابێ عومرم خۆم بە میوانت ئەکەم
ڕۆژی ڕاوەستان لەدەشتی مەحشەرا لێت موددەعیم
زوڵمی تۆ خوا حاکمێتی تووشی ناڵانت ئەکەم
من ئەمە ڕەفت‌و گفتمە ڕەنی ڕەوان‌و ڕاستمە
باوەڕیش ناکەی حەواڵەی کافرستانت ئەکەم

بۆ ڕەزای خواو پێغەمبەر زەرەیەك لوتفت بێ
تا نەبم دەعواچی قیامەت ڕوو بە یەزدانت ئەکەم . . .
تۆ غەریبی یەك تەبیبی (ئەحمەدا)وا دەربەدەر
وا لە ئینسانی کە دەرچووی نەقڵی حەیوانت ئەکەم



## چوارینە

ساقی تەوانای ئالامم نیە
بێ مەی و بێ جام ئارامم نیە
دەبێنە جامو دەبێنە مەی . دەی ؟
تۆ نەبێ ، بێ تۆ من فام نیە

# - تابلۆ -

١٩٧٧

وەرە گیانەکەم وەك جونیێ دڵدار
بچینە ژێر سای دارێکی بەهار
ئەو دارەش چی بێ ؟ با ئەرخەوان بێ
کەوەك روخسارت گەشاوەو جوان بێ
چەپکێ نێرگسی تازە پێچراوە
بەتاڵێ دووتاڵ لەو زوڵفە خاوە
ئێنجا وەك بولبول تۆ بێژە ئاواز
منیش گوێ ئەگرم کەساس‌و بێ‌ناز
تۆ پێ‌بکەنە بۆ پیری بەسۆ
منیش تێر ئەگریم بۆ جەوانی تۆ
بەبێنە تابلۆی پیری‌و جەوانی
شێوەی کلۆڵی‌و هی کامەرانی
چونکە دوارۆژی چەرخی زەمانە
چەمن چە بۆتۆ شینەو گریانە



# - ڕەنجی بێبەر -

ڕۆژی بەهاریٚ دەمی خۆر هەلاٚت
خەیالٚ بردمی ولاٚتەو ولاٚت
لەبن کێوێکا لە پەنا بەردیٚ
کێوی زەمانە نەك بەردی هەردیٚ
لەژێر توێژاڵی دوا بەفری زستان
کەزێڕین ئەبیٚ بەخۆری بەیان
دیم چووزەرەیەك وەك نەمامی دار
لە زستان دەرچوو گەیبو بە بەهار
لەکۆنە جێگەی گەلاٚی وەریوی
دووگۆپکەی تازە ، لەم دیو لەو دیوی

* * * * * * * *

لەولاوە لەسەر بەردێکی بەرزتر
بێچووە بولبولێك هات بە فڕەفڕ
نیشتەوە لەسەر ئەو چڵە دارە
کە نەڕەنگی گوڵ نە گەلاٚی دیارە
پاش نەختیٚ خوێندن ڕۆیی بۆ دوا ڕۆژ
هاتەوە لای چڵ وەك سۆفی بۆ نوێژ

ڕۆژبوو بە هەفتە ، هەفتە بوو بە چوار
بێچوو بیٚوچان ئەیخوێند لەسەر دار
تا دار گەلاٚیکرد خونچەی دا دیاری
وای لیٚهات بلبل بخاتە زاری
خونچە گەشاوە شەونم لەسەر زار
وەك لێوی دولبەر پڕ نەشئەو ئاودار
کەچی لەناکاو خالۆی ڕێبواریٚ
نووشتاوە بەسەر گالۆکە خواریٚ

چاوی کەوت بە گوڵ لەناو چەن چڵا
شیرینیی گوڵی چەسپی بە دڵا
پێ لێکدانەوە لە چڵی پچڕان
بە گاڵۆکەوە کەوتەوە ڕێوبان
پاش تۆزێ سیس بوو هەڵی پچڕکان
کزەبا پەڕی لە درگێك ئاڵان

* * * * * * * *

گیانە من بولبول تۆش گوڵ خونچە بووی
شای نەوجەوانیو لارو لەنجە بووی
پەروەردەم کردی لەناو لانکی دڵ
لای لایەم کردی بە سۆزەی بەکوڵ
بە فرمێسکی سوور بەشەو بێداری
لەلای تۆ فێربووم دەرسی دڵداری
کەچی چەرخی چەپە تۆی لێ فڕانم
ڕەنجەڕۆی کردمماڵی وێرانم
وا لەگەڵ بولبول یەك دەنگو ئاوات
ئەو ئەگری بۆ گوڵ ، منیش بۆ وڵات

* * * * * * * *



# (تلميـــع)

## - تێهەڵکێش لەسەر غەزەلێکی (حافظ)ی شیرازی -

پـــــەشیمان نیم لـــــە گفتی خۆم لــــەگەڵ ئـــــەم هـــــەمووە ئـــــازارەم
(مـــرا عـــــهـــــد یست بـــاجـــانـــــان کـــه جـــان دربـــدن دارم)
بـــە خـــەنجەر پـــارچـــە پـــارچـــەم کـــەن هـــەتـــا مـــاوم لـــە دنـــيـــادا
(هوا خواهی کویش را چوجـــــــــــــــــــــــــان خویشتن دارم)
چـــە بـــا کـــمـــە دیـــدەکـــەم کوێربێ یـــا دڵ بـــێتـــە خوێنـــاو من :
(فـــــــــروغ چشم‌و نور دل ازان مـــــــــــــــاه خستن دارم)
کـــەمن شەیـــدای ئـــەو لـــێوەم دەبـــا هـــەر پـــێم بـــڵێین شێتـــە . .
(چـــــه فـــــکـــــر از خـــبث بـــدگویـــان بـــيـــان انجن دارم)
لـــەسەر ڕووی زەمین تـــاکو ئـــەگاتـــە میهـــرو مـــاه وەڵڵا :
(نـــدارد هـــیچ کس یـــاری چـــنین یـــاری کـــەمن دارم)
لـــەسایـــەی سایـــەی ئـــەو سەروەی لـــە بـــاخی سینـــەمـــا سەوزە
(فـــراغ از سرو بســـتـــانی‌و شمشـــار چـــمـــــەن دارم)
کـــەمن ئـــەو شۆخـــە یـــارم‌بێ لـــەسەد دوژمن حـــەزەر نـــاکـــەم
(چوا سم اعـــظـــم بـــاشد چـــه پـــاك ازاهـــر من دارم)
فـــــەلـــــەك دەستم بـــــە داوێنت سەعـــــاتێ بمدەرێ مۆڵەت
(کـــەمن بـــا لـــعـــل خـــاموشش نهانی صـــد سخن‌دارم)
ئـــەگەر ئوردووی خـــەم‌و هـــیـــجـــران هـــجوومـــیش کـــەن لـــەلام هـــیچـــە
(بحمـــــــــدالله والمنـــــــــه بێ شکـــــــــر شکن‌دارم)
دەبـــا بـــاری صـــەبـــا لادا لـــەسەر ڕووو زوڵف‌و کـــاکۆڵی
(نـــەمـــیـــل لالـــەو نسرین نـــه بـــرگ یـــاسمن دارم)
دەسا بۆم تـــێکـــە ئـــەی ساقی لـــەپـــاش سەد تۆبـــە فـــنـــجـــانێ
(کـــــەمن در تـــــرك پیمانـــــــه دل پیمان شکن دارم)
لـــەسەر شانم وەلـــەو بـــارە هـــەزار جورم‌و گونـــاه (ئـــەحـــمـــەد)
(چـــه غـــم دارم لـــەدر عـــالم امین الـــدین حسن دارم)

* * * * * * * *

# بۆ دوو گوڵ

وێڵ و سەرگەردانی (دولبەر) شێت و شەیدایی (سەمەن)
ماڵ و سەر قوربانی (دولبەر) گیان بە فیدایی (سەمەن)
گەر نەکەن باوەڕ بە (دولبەر) سوێند بەوی تریان ئەخۆم
سا بەحەقی ئایینەیی سەر کوڵم و گۆنایی (سەمەن)
ڕەش بووە جەرگم بە وێنەی خاڵەی (دولبەر) تەواو
پێچ ئەخۆم وەك حەلقەیی کاکۆڵی تاتایی (سەمەن)
کوشتەمی (دولبەر) بەداخ و بۆ ئەوەی بژێمەوە
یەك نەزەر بەسمە لە لوتفی وەك مەسیحایی (سەمەن)
پەرچەمی (دولبەر) ڕەشە بۆیە جیهان نیوەی شەوە
ڕۆژە وەختێکیش کە دەرکەوت ڕوویی زیبایی (سەمەن)
پڕ لە عەشقی دولبەرە دڵ لێم گەڕێن با ببمە خاك
ئەچمە ناو کڵپەی جەهەننەم بۆ تەماشایی (سەمەن)
با لەتاو (دولبەر) زەلیلی دیدەکەم هەڵ دێتەوە
گەر وەکو تەرسا پەنا بەرمە کڵیسایی سەمەن
جەژنە وا (دولبەر) سبەینێ ئەمکەنە قوربانی تۆ
گەر خودا نەمخاتە بەر نووری تەجەللایی (سەمەن)
بولبولی دڵ چۆن تەوانای شیوەنی دوو گوڵ ئەکا
گاه گاهێ شینی (دولبەر) گاه وا وەیلایی (سەمەن)
وا بەسەوداوە ئەناڵم چەرخی گەردوون ڕەحمەتێ
یا ویصاڵ و ماچی (دولبەر) یا شەکیبایی (سەمەن)



# – پەیمانو شیوەن –

شەرتە تا رۆژی حەشر خولیایی من بێ چاوی یار
وێڵی صەحرایم هەمیشە تەرك ئەكەم خوێشو دیار
شەرتە خوێنم یا بەگریان ئەرێژمە صەفحەی عەدەم
یا بە شمشێری رەقیبانا ئەبێ بتكێتە خوار
شەرتە وەك مەجنوونی بێكەس دەشتو كێو بێ مەسكەنم
تا بەداخی لەیلەوە دەمێنێتە قەبری تەنگو تار
شەرتە وەك فەرهاد قوڵنگی یادی شیرین هەڵگرم
تا لەپای كێوی فیراقا جێ دەهێڵم یادگار

شەرتە وەك یەعقوب لە دووری یوسفی گوم گەشتەكەم
سینە پڕ غەم ، دیدە پڕ نەم تا ئەبەد نەگرم قەرار
شەرتە وەك ئازیز مەردە سەر لە ئەژنۆ بەرنەدەم
بۆ دڵەی وێڵو غەریبم دائیما بگریم بەزار
شەرتە وەك بولبول بەشیوەن قەت لێو چڵ بەرنەدەم
تا دەمی خونچەی ئەمەل نەكرێتەوە صوبحی بەهار
شەرتە وەك دێوانەكەشكۆڵو عەصایەك هەڵگرم
بێخەمە لاوە بەجارێ عیززەتی نەفسو ویقار

شەرتە بمبێ تاجی (خەسرەو)گەنجی (قارون) تەختی (كەی)
هەر لەدەرگای ئەوا بمرم كەساسو خاكسار
شەرتە رەنگینكەم لە داخی تۆ بە ئەشكی دیدەكەم
عەردو بەردو شاخو داخو لالەزارو جۆیبار
شەرتە یا حەسرەت لەگەڵ خۆما ئەنێمە قەبرەوە
یا ئەبێ بژم لە خونچەی ئەو شكۆفەی لێوی یار

●

# پێنج خشتەکی

ناکرێ بۆم شەرحی دەردم بەم غەم‌و هیجرانەوە
بەم دڵی لەتلەت کراوم هەروەکو بریانەوە . . .
جەرگەکەی ئەنجن کراوم بەم دەمی تەبرانەوە
قەلبەکەی خۆراکی ماسیم بەم بنی بەحرانەوە
چۆن گرفتارم خودایە من بەدەست ناڵأنەوە

وا بەعەشق زنجیر کراوم دائیما هاوار ئەکەم . . .
هەم گرفتارم . . . چاهی حەسرەت ئەفکار ئەکەم
شەش‌دەرم لێ بەستراوە کوللی ئانێ زار ئەکەم
روو لە قاپی عەرشی اعلام ڕێگەیە پرسیار ئەکەم
حاڵەتم مەجنوونی‌یە بۆ دۆستەکەم لەیلانەوە

هەردەمە مردن ئەخوازم ، هەردەمە دادو ئەمان
جێگەی ڕوح سەختە یارەبی زەحمەتە دەرچوونی جان
ئینتیحاریش بۆ مسولمان دێتە دینی کافران
پێم بکە ڕەحمێ بەهەر نەوع ئەی خوای جەمعی جیهان
وا خەریك ماوم لە دەشتی بێکەسی دەورانەوە

ناوی یار هەرچەن کەدێنم بەخششی تاجم ئەکا
بەحری حەسراتم بەجارێ جوم‌بوش‌و جەولان ئەکا
قەترە فرمێسکم وەکو لافاوێ خوێن جەرەیان ئەکا
ناڵە ناڵم حەوتەمینی ئاسمانان کەشف ئەکا
هەروەکو یەعقووب لەدووری یوسفی کەنعانەوە

پێت ئەڵێم باوەڕ بکە تۆ لەیلەکەم سیدقت ببێ
گەر لەپاش سەد ساڵی تر بێ زەڕەیە ڕەحمت ببێ
نامەوێ تاجی شەهنشا ، هەر ئەوەند لوتفت ببێ
دارعەساو کەشکۆڵێ هەڵئەگرم وا ئەتۆ مەیلت ببێ
تا خودا حەقم ئەسێنێ وام بەڕووی بیابانەوە

وا لەبەر قاپیت کە ئەمرم ئاورێکم لێ بدە
پێکەنینت غونچەیەکە سوبحە سادەم پێ بدە
وا لە دەرچوونا کە ڕۆحم خوێن مەکە ماچێ بدە
ئەم گوناهی کوشتنی من تۆ لە شانت لا بدە
بەڵکو زیندووبم لەحاڵی قەبزی ڕووحو جانەوە

چی بڵێم نازانم ئیتر وا کە بەخت ڕیسوام ئەکا
صاحێبی دانەی گەوهەر بووم وەك تەیر پەروام ئەکا
هەر بەدڵ خۆشی سبەینێ تەفرەوو بڕوام ئەکا
تا لەناکاواو بەجارێ گردی سەیوان بانگم ئەکا . .
دەورو تەسلیمی قیامەت دێتە بەر مەیدانەوە

صەد بەجێت هێشتم بەقوربان من غولامیت هەردەکەم
خاکی بەر دەرگانەکەی تۆ قیبلەمە ڕووی تێ دەکەم
فەرزە بۆمن ڕۆژی جارێ کەعبەیەو حەجی دەکەم
گەر خوا سەلیم بکا من دائیما هەر وا دەکەم
(ئەحمەد)م نووری جەمالت خستمیە تارستانەوە

●

## - تاکە -

ئەگەر چاوم لە تۆ جوانتر کەسێکی دی هەتا ماوم
ئەڵێم خوایە لەو دنیاش بەساغی هەڵنەیە چاوم

# دەردی عەشق

١٩٣٣

خوایە کەس تووشی نەبێتە دەردی بێ دەرمانی عەشق
کەس نەبێ دووچاری تیرو خەنجەرو زیندانی عەشق
هەرکەسێ زۆر زۆر بە جەرگەو پاڵەوانەو قارەمان
با بتوانێ بەرگە بگرێ گەر بووە میوانی عەشق
عەشقە پەروانە دەکاتە زەرەیەك خاکی سیاه
ناوی مەشهورە کە مەجنوون بۆتە سەرگەردانی عەشق
زاڵمێکی وایە عەشق فەرهادی کردە کۆهکەن
حوکمیدا بۆ قەتڵی (مەنصوور)حاکم و سوڵتانی عەشق
شەمسی تەبریزی کە سوتا کردیە کۆهی زوخاڵ
پەڵپەڵەی خوێن کەوتە جەرگی بولبولی خۆشخوانی عەشق
چەن جوانی جوانەمەرگ کرد ، چەن هەزار شاهو گەدا
دەردی بێ دەرمانو دانی بێسەرو سامانی عەشق
عالەمی خستۆتە هۆهۆی کۆڕی زیکری خۆیەوە
شێخەکەی بەرماڵ بەشانو قوتبەکەی ڕەببانی عەشق
نەك هەمووی عەشقی خوایێ ، ئەغلەبی عەشقی ترە
بولبول و گوڵ ، لەیل و مەجنون ، غەوسەکەی گەیلانی عەشق
وا ئەزانم جەمعی عاشق گشتی هەر مەقلوب ئەکا
لەشکری شمشێر بەدەستو خاوەنی قەڵغانی عەشق
(ئەحمەد)یش پرشنگی بەرکەوت بوو بە عەبدو چاکری
ئەو نەمامی تازە خەڵفە تا ئەبێ قوربانی عەشق



# لە شەوا

## «لەنووسینێکی مامۆستا (أ.أ) وەرگیراوە»

کەرۆژ ئاوابوو شەوهات بەسەردا
هەموو گیانلەبەر لەشارو دەردا
لەپاش ماندوێتیی تەقەلای ژیان
ئەحەسێتەوە بەخەوتنی گیان
هەر شەوە گوڵان بەدەستەمۆیی
رۆژ ئەکاتەوە بۆ سەربەخۆیی
بە شنەی فێنکی نەسیمی بەیان
ئەبووژێتەوە خونچەو گەڵایان
ئێمە کە چاومان بە تاریکە شەو
هەموو ئەڕێژرێ بە کلچۆکی خەو
گەلێ دڵانی پڕ خورپەو خەتەر
هەیە بە وێنەی جێ دەمی نەشتەر
لەگەڵ لێدانا هەڵئەقوڵێ وەك ئاو
خوێناوی گەش‌و حەسرەت‌و زوخاو
گەلێ چاوانی پڕ فرمێسکیش هەن
ئاوی نەمامی دڵداری ئەدەن
گەلێك مێشکی تێگەیشتوان
نوێ ئەکەنەوە رابووردووی زەمان
چەن لاوو جوانان بە ئەشکی خوێنین
بە پرچی پەشێو بە دڵی غەمگین
لەپەورو کەوتوون لەبن پاساران
لەژێر چەپۆکی مەرگی بێ ئەمان . .
یەك دەقیقە خەو ناچێتە چاویان
هەر ئەتلێنەوە تا بەری بەیان . .

چەن هەزار لاوو نازەنینیش هەن
لەژێر دوو باڵی شەوا بێ‌محەن . . .
لەگەڵ دڵداری دەس لە گەردنا
لەناو گوڵزاری خۆشەویستنا
خەریکن بەکوڵ بە خونچە چنین
بە بژاری خار دەم بە پێکەنین
لەو دەمە دەمی وا بەسینی شەو
کە ئێمە چاومان چۆتە شیرین خەو
بە خوێنی پاکی ئاڵی شەهیدان
دامانی ئاسۆ رەنگ ئەکا بەیان
گەلێ گیرۆدەی زنجیرو زیندان
هەموو وەك شێرو بەچکەی شێران
بۆ رێی سەربەستی‌و بەرزی ولاتیان
ئەو بەندو کۆتە خەلاتە لایان
بە جووتێ باڵی پر تین‌و تاوی
لەهێزی لاوی .دروستکراوی
لەتاری‌و لێڵی ئاسمانی ژینا
بێ‌باك‌و پەروا وان لە فڕینا
جارجار لە دەنگی ناڵەی هەژاران
لە سۆزی گریەو شینی داماوان
لە ئێشی زامی دڵ بریناران
لە لاوانەوەی سووتاو جگەران
دێتە لەرەو لەرز گەردون بەیەك جار
ئەخرێتە سەرپشت قاپی کردگار
هەر شەوەو پەردەی پێشەی رۆژگار
پێشەی ئازارو بێشکەی دڵداری
کە گزنگ دەرکەوت شەو کەوتە فیرار
یاللا سەر لەنوێ بۆ کرێکاری

# هاتنێك

هەڵکرا شەمعی قدوومت مەجلیسم ڕۆشن کرا
وشکی کرد باغی فیراق‌و شکڵی گوڵ سەوسەن کرا
گیرەوەی دەیجوورو میحنەت رایەدەی تۆفان‌و غەم
لەشکری میحنەت شکاو ڕووبەڕوی مەئمەن کرا . . .
خێرێ یارەیێ قدوومت هەر بەخێرێ ڕۆحەکەم
بەم قدوومی ڕۆستەمانەت قتلی ئەهریمەن کرا
هاتنت یەکجارییێ‌و ڕۆینت نەی بینمەوە
ڕەنگە کوێرێ دیدەکانم گەر تەرکی مەسکەن کرا
ئەم دەقیقەی خۆشە دنیا پێت موشرق‌بو کە چاو
عوشرەتم خەرمەن کراوە ، میحنەتیشم شەن کرا
بوومەوە مندالێ شیری چوومەوە بەرگی سروور
بوومە شاهەنشاهی بەزم‌و مەجلیسم ڕۆشن کرا
(ئەحمەد)ە شێتی دوو ئەبرۆت ڕەحم‌و لوتفێکت ببێ
بێگەرێ زنجیرکراوە گیرەوەی ئەرمەن کرا

# چوارینه

پڕ دەردو مەینەت‌و کەیلی جەخارە دڵ
ساقی وەرە دەمێکە کەوا ئینتزارە دڵ
تێکەو بگێڕە بادە جام‌و مەی دەسا
تا مەیلی هەر لەسەوزی‌و گوێ جوێبارە دڵ

# پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلێکی (کوردی)

وەها کەوتوومە ژێر بەندی خەمو هیجری ستەمکارێ
هەمیشە زارو نالێنمە لەحەسرەت عەشقی دڵدارێ
دەسا توخوا ڕەفیقان بێن بەدەنگ ڕۆڕۆمەوە جارێ
(ئەمان مردم عیلاجێ سا لەڕێی پێغەمبەرا چارێ
ویصاڵە . یا قەتلە یا تەسکین لەهەرسێ بۆم بکەن کارێ)

خوا ئەم ئێشو ئازارەم بەزامی عەشقەوە تاکەی
بەسە ئیتر لەعومری نەوجەوانی خۆم نەکرد ئۆخەی
دەخیل ئێوەو خووا یاران عیلاجم کەن بەجامێ مەی
(وەها سووتاوم ئەسلەن تابی فریادم نەما سادەی
ڕەفیقان نیوە سووتن ئێوە نامەرد عەرزە هاوارێ)

تەماشای چۆن ئەکێشم بۆی جەفاوو قەهری مەفتوونی
لەدەستا تیشەیی فەرهاد . لەسەردا شۆڕی مەجنوونی
لەحەسرەت قامەتی بەرزو فیراق لێوی مەیگوونی
(لەکونجی سینە دەنگی ئایو وای دڵ دێ بە مەحزوونی
وێرانێ نەمدی ساتێ لێی نەیە ناڵەی بریندارێ)

هەموو خاکی بەری پێتم وەکو عەنبەر بەسەردا کرد
ئەوەت لایق نەبینی پێمو دامانت بەلادا کرد
خوا هەڵناگرێ گیانە منت شێتو بەڕەڵلا کرد
(ئەلای هەرکەس دەچم مەنعم دەکا خۆت بۆچی ڕیسوا کرد
درێغ بۆ حاڵزانێ . ڕەبی تووشم بێنی بیمارێ)

بەسۆزی گریەوە چاوم هەمیشە سوورو نەمناکە
سەراسەر سنگی بەدبەختم هەتاکو دامەنم چاکە
لەخوێنا تل ئەدەم بەسیەوەرە حاڵم تەماشاکە
(لەژێر باری غەما وا شانی سەبرم ڕیشە ئێستاکە
فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕی لێم بۆتە سەربارێ

گڕی بەرداوەتە جەرگم بەسەودای عەشق وەك ئاگر
کەساس و دڵ بریندارو پەرێشان . بەو بەشەم صابیر
ئەوەندەش دڵ ڕەقە بۆچی گوناهی من چییە ئاخر ؟ ؟
(لەنەزعا پێی دەڵێم قوربان جەفا بەسیە دەڵێ کافر
هەما چەت دیگە تۆ سەگ مەرگە کارم ماگە پێت جارێ)
لەمەی غافڵ مەبە ساقی زڕەی فنجانەکەت با بێت ؟
بە نەشئەی جامەکەی تۆیە غوباری غەم لەدڵ دەرچێت
لە هوشیاریم بەدەرکە هەی سەرو ماڵم فیدای تۆ بێت
(صەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من دەپرسن لێت
بڵێ کێشایە مەیخانە دووچاوی بێچووە عەیاری)
(ئەخۆڵ) هەربگری تا دەمری لەسەر قەبری جەوان مەردی
بەقەد لێزمەی بەهاران و گوڵاڵەو شەستپەڕی زەردی
سەراسەر سوورو ڕەنگینکە بە ئەسرین ئەلحەدو بەردی
((دوڕو یاقوت دەبارێ لەم کەلامە شیرینەی کوردی
درێغا کوا لە دنیادا قەدرزان و خریداری) ؟

## چوار خشتەکی

**کە دوێنێ شەمعی مەجلیس بوو چریسکەی ڕوومەتی ئاڵی**
**ئەوا ئەمڕۆ ئەڵێی داغە لە جەرگا فیرقەتی خاڵی**
**بەڵێ : عاشق ئەگەر سەد بار بنۆشێ بادەیی عوشرەت**
**ئەبێ هەر ئاخری بخوا بەسەر شیرینیا تاڵی**

# پێنج‌خشتەکی لەسەر غەزەلێکی (کوردی)

**١٩٧٨**

گەوهەری تاقانەی ، یا خاوەنی تەختو عەلەم
یا نموونەی جوانی جوانیت ، یا بتی یاخو صەنەم
یاخو مانگی چواردەمینی ، بۆ سەماواتی حەرەم
(حۆریی ڕەوضەی جەنانی ، یا گوڵی باغی ئیرەم
ام نجوم العرش ام شمس على فوق العلم)

پێم وتی : نەمخەبتە داوی تاوی ئەگریجەو بڕۆت
خستمت تا بوومە کۆیلەو پاسەوانی دەرگە بۆت
گوێت نەدامێ بێوەفا ، نەك هەر تەرەت کردم لەخۆت
(ئاخری کوشتت بەهیجران ئاسکەکەی دەرماڵی خۆت
(کم ندیت بالنداء لا تقتلی صید الحرم)

ئای کەلێت پارامەوە ، ئەی گیانی شیرینم نەکەی
من کە پەروانەی سەری تۆم بێ پەروا باڵم نەکەی
بێپەڕو باڵت کە کردم حەق نەبوو وام لێ بکەی
(کوشتمت ئەمما لەپاشا پەشیمانی دەبەی
یا حبیبی بعد قتلی لا حصول في الندم)

ئەو کەسانەی سەرزەنشتی من بکەن زۆر ناکەسن
چونکە پێکراوی ئەوینو دڵ بریندارم ئەمن
با بکوژرێم من لە ڕێتا ملکەچو شادم کە : من
(کوشتنو عەفوت لەلای من هەردویان هەروەك یەکن
لو تمنى ترحمي لو تدفني عين الكرم)

کوشتمت ئەشلیێی ڕەقیبو دوژمنم شادکرد بەجیێی
خۆ ئەڵێی پێش کوشتنیش کۆسپی ترم خستۆتە ڕیێی
گیانی ویلم پێم ئەڵێ گەر بێتو بەویارەت بڵێی
(گەر وەکو عیسی لەپاش مردن بەسرما ڕابوریێی
تجمع العظم الرحیم تحیینی بعد العدم)

من وتم : تۆ گیرەوەی ئەو چاوە جوانانەم بکەی
یاخو سینەکون کونی ئەو تیری موژگانەم بکەی
نەء . . بەلاّم ئەتوانی چارەی ئەم هەموو ژانەم بکەی
(وەك طەبیب گەر بێو عیلاجی ئەم برینانەم بکەی
اعطیك الروح لان تقتله عن حق القدم)

وا لەکونجی عەزلەتا کەوتوومو دەس بەستەی وەفام
دوور لەخۆشیو خۆشەویستی دڵشکاوو نابەکام
لێت ئەبوورم گیانەکەم نالێم وەرە بۆلام بەلاّم
(سەد کەمەحزونو نەخۆشم نامەکەت گەر بێتە لام
یتدفع حزني ولا یبقی من القلب الم)

گەه نەخۆشو گەه مەلولو گەه برینارم خووا
خۆم ئەلێم : هەر مردنە لەم ژینە تالّم کارەها
وا لەگەلّ تۆدا ئەلێم (کوردی)وتوومە جارەها
(شەرحی دەردی هیجری کوردی قەت نەهاتە ئینتیها
تمت القرطاس ، جف الحبر ، وانشق القلم)



## حالْ شێواوی

حـــالّی شێواوی دڵی خۆم بۆ زەمـــان ئـــیـــنشـــا ئـــەکـــەم
من کـــە بـــەدبـــەختو کـــەشووفـــم نـــاوی خۆم ئـــیـــجـــرا ئـــەکـــەم
هـــێـنـــدە بـــارانی بـــەهـــاران دێتـــە خواریْ چین بـــەچین
هـــەم وەکو فـــرمـــێسکی عـــاشق ذیللـــەتم ئـــەعـــدا ئـــەکـــەم
یـــەك بـــەشێتو یـــەك بـــەهـــارو کـــەم عـــەقـــڵم پێ ئـــەڵێ
یـــەك دڵی نـــادانـــە ئـــاخۆ خۆمـــە خۆم ڕیسوا ئـــەکـــەم
شێتو هـــارو نـــادانو بێ عـــەقـــڵ بـــێـــەشم ئـــەمما فـــەقـــەت
واریسی مـــەجـــنوونـــە شێتـــەم عـــاشقی ئـــەحـــیـــا ئـــەکـــەم
یـــا وەکو تیرێزی سووتـــان (ئـــەحـــمـــەد)ا فـــەرهـــادی یـــە . .
عـــاقـــیـــبـــەت بێ ئـــەنجەل ئـــەمـــرم نـــاوی خۆم ئـــیـــبـــقـــا ئـــەکـــەم



---

## تا کەی « بەهار »

یـــەکیْ نـــەمـــام ئـــەروێنیْو یـــەکیْ نـــەمـــام ئـــەنـــێژیْ
ئـــەمـــیـــان چـــاوەڕیْی گوڵەو ئـــەویـــان فـــرمـــێسك ئـــەڕێژیْ

---

# دوا ئەوینم

١٩٨١

جوانێك لە جوانی تۆ جوانتربێ کوانێ ؟
چاوێك لە چاوی تۆ گەشتربێ کوانێ ؟
بەلاٚم چبکەم نازانم چۆن بتدوێنم
ڕوو بەڕووی خۆت بیلێمو بیدرکێنم
بلێم ئەی جوان لەدوا تەمەنی ژینا
لەناو ناخی دڵی پڕ لە ئەوینا . . .
لە قوڵترین جێ یا جێگەی خۆت خۆشکرد
بادەی عەشقێکی تازەت بەمن نۆشکرد
وا سەر لەنوێ فێری دڵداریت کردم
فێری هۆنراو ، ئاوازو گۆرانیت کردم
ئینجا دەستم داوێنت ئەی شۆخو شەنگ
بگە فریام دووچاری تۆم بەبێ دەنگ
دڵشکاوم نەکەی دڵم بشکێنی . . .
زۆر گریاوم دەخیلە نەم گرێنی
نالێم تاوێك سەرم بخەمە سەر ڕانت
یا خوا نەکردە ماچی بکەم لێوانت . . .
یا بشکێنم تینوێتی لێو لە لێوت
یا دەس بەرم بۆ باخی شەکرە سێوت
هێندەم ئەوێ جارجارەیەك بمدوێنە
لە دووریشبێ قەدو بالاٚت بنوێنە
چاوو دڵم پڕە لە خەندەو نیگا
بۆ ڕووناکیی ناو گۆڕەکەم بە تەنیا
یاهیچ نەبێ جلوەی چاوت لەچاوما
ببێ بەتیشوویەك بۆ ئەوە دنیا

# نامەیەك بۆ شێردڵ

« شێردڵ برامە . ناوی نووری ئەحمەدی تەهایە . کاتێ کە لە بەندیخانەبوو ئەمەم بۆ وتووە : »

برای شیرینی گیانی بەگیانیم
سەرمایەی ژین و ، هۆی کامەرانیم
تاسەی دوریتم هێندە لا سەختە
گەیانیە پیری تەمەنی جوانیم
- ئەزانی چلۆن پەشێوم بۆتۆ ؟
هەروا بەرەڵا لەم شارو لەو کۆ
بنوم ، دانیشم ، بگریم ، پێکەنم
یادم شەوورۆژ هەرتۆیت و هەرتۆ
سەرابی دووری تۆم هێندە دیوە
لێڵایی پەردەی چاومی تەنیوە
ئای چەندە دووری دیدارەکەی تۆم
چۆن دڵ لەشادی و خۆشی هەتیوە
بێ تۆ لەباخا لەناو گوڵزارا
لەناو چیمەنو ، لە لالە زارا
پووش و پەڵاشە هەر درك و داڵە
لەدڵی تەنگی منی هەژارا
- بەبیرو هۆشا نە دەهات هەرگیز
بەهاری ژینم بگاتە پاییز
- ئەزانی گەردوون چی بەسەر هێنام
دانکەل ، موو سپی ، گوێگران چاوکز
کام بەردی فەلەك قورس و گرانە
چە نەشتەرێکی تیژو بەژانە

دای بەسەرمدا کردی بە دڵما
گرفتاری تۆ لە بەندیخانە
بەڵام براگیان نەکەی دڵتەنگ بی
لەبانگی ڕاستی کپو بێدەنگ بی
هەروەك شێردڵ بووی شێرانە بژی
لەزیندانا بی لە کۆڕی جەنگ بی . .
تۆ لەزیندانا لەڕێی وەتەنا
من لەژێر کۆتو بەندی میحەنا
هەردوو وەك بولبول هیوامان یەکە
لەش لەقەفەزو ، دڵ لە چەمەنا
من لەگەڵ تۆمو تۆش لەگەڵ منا
تەوق ئەسارەت وا لە گەردنا
پشت بەخوا ڕۆژێك هەر ئەبێ بشکێ
ئەو تەوقو کۆتە لەسەر دوژمنا

---

# چوارینە

**لەناو جەوری زەمانەو خەم : بەبێ دەنگی ئەناڵێنم**
**لەبەر لۆمە لەناو دڵما کۆڵێ فرمێسك ئەتاسێنم**
**لەگەر شادی نەکەی گیانە دڵی پەستم بە دڵداری**
**وەکو لێزمەی بەهاران خوێن لەکانی دیدە ئەڕێژم**

---

## — بەهاری —

بەهارم هاتەوە یاران عەجەب شیرین بەهارێکە
بە خونچە سووربووە سەحرا بەگوڵ سیمین عوزارێکە
دەمێکە مات‌و خامۆشە لەبەرێ بولبولی گوڵزار
ئەوا ئێستاکە خۆشخوانە لەسەرچڵ عەینی تارێکە
چریکەی پۆڕو جیکەی چۆلەکەو ئاوازی قومری دێ
شەقەی باڵی کەوو کۆتر لە ئاسمان وەك قەتارێکە
تەماشای چیمەن‌و سەحرا بەشۆخ‌و دڵبەران ڕازا
کە هەریەك نازەنینێکی وەکو سەروو چنارێکە
برا بڕوانە ئەترافت چیا وەك شاهو شاهەنشا
لەسەریا تاجی بەفرە یا تەم‌و تەنکە غوبارێکە
بەیانیش ڕۆژکە پەیدابوو لەسەر تەوق سەری هەڵدێ
قەمەر وەك نەجمەکەی شانی شەماڵیشی نساریکە
لە هەرلایەك تەماشاکەی هەزاران دڵ ئەبێ ئەحیا
لەبن هەر سەوزەگیایەکدا میسالی حەوزو فوارێکە
شنەی با دێ نەسیمی دێ ، ئەڵێ : ئەی (ئەحمەد)ی دەروێش
لەخەو هەڵسە تەماشاکە لەیارت گوڵ عوزارێکە



# ئەی بێ وەفا

خۆتۆ خوا نەبووی سوجدەم بۆ بردی
وەك بتو صەنەم لەملم کردی
تاق ئەبرۆتم کردە قیبلەگاه
بەر دەرگاکەتم کردە خەڵوەت گاه
ناوی تۆم کردە ویردی زمانم
لەجێی تەهلیلەی ڕۆژو شەوانم
جگە لەمانەش ئەرکی دڵداری
لەگریەو ڕۆڕۆ شیوەنو زاری
ئەمانە هەموو تەمەنی جوانی
پێشکەشم کردی زۆر بە ئاسانی
کەچی نەمزانی چی وای لێ کردی
ئەو دڵە ڕەقەی نەرم نەکردی
بەڵام ئەزانم ڕۆژێ لە ڕۆژان
لەم دڵ ڕەقییەت ئەکا پەشیمان
لە پەشیمانیش هیچ سوود نابینی
ئاسن بە ئەژنۆت ئەبێ بشکێنی
بۆمنی کڵۆڵ وا پەتیارەت کرد
بۆ خۆیشت کە خۆت ، خۆت بەم دەردە برد



# (( شینی بێکەس ))

دای بەگوڕا بای شەماڵ دەنگی بەسوێی گریانەوە :
شینە : شینی تۆیە بێکەس کەوتە ناو یارانەوە
سوورو لێڵ بوو چاوی کوردی قوڕ بەسەر دڵ پڕ لە زام
ئەم برینەش بوو بە زامی سەختی سەر زامانەوە
کۆچی ناوەخت و لەناکاو مردنی تۆ سەر بەسەر
بوو بەداخ و کەوتە جەرگی کوردو کوردستانەوە
مانگ و ڕۆژی ئاسمانی کوردو ئەستێرەی هەموو
هەر بە شوعلەی بیری تۆ بوو گشتی ئەدرەوشانەوە
دێتە گوێی یادم لەرێگەی میلەتا ئێستەش زرەی . .
کۆت و زنجیری دەس و قاچت لەناو زیندانەوە
تۆ نەمردووی با لەشت بزرێ ، لەخاکا هەر ئەژی
نەعرەتەی ئازادی خواهت بەم کەژو کێوانەوە
قەت بەدڵتا ڕانەبووری : بێکەسی : چونکە کەسن
نێرومێ گەورەو بچووکی کورد بەپیرو جوانەوە
داخەکەم بێدەنگە بێ تۆ کۆڕی یاران و صەفای
ئەی چە بەزمێکت دەخستە مەجلیسی ڕەندانەوە
تۆ بەجێت هێشتم ئەبێ لۆمەم نەکەی گەر بێ منیش
دڵ بدەم ئینجا بە خاکی گردەکەی سەیوانەوە
کاکە (فایەق) لێم ببورە (پێ)م نەبوو پێی بێمە لات
وا بە ئەشکی سووری دووری ئەم گوڵەم ڕازانەوە



# - سكالآیەك -

چە تەدبیر ئەی مسولمانان سەراپا غەرقی خوێناوم
ئەلێ تەرزەی بەهارانە ئەرێژی ئەشكی سوور چاوم
بە دوو شت جوانە مەرگم یەك نەبوونی كەس بەكەس بێنم
دووەم كوژراوی شۆخێكم كە دڵ پڕ دەردو زووخاوم
وەسیەت بێ ئەوا ئەمرم مەكەن هیچ شین‌و زاری بۆم
بەلام زۆر بێكەسم یاران تووبی خوا وون مەكەن ناوم
مەدەن هیچ ئەزیەت‌و جەورێ جلی خۆم كفنمە بەسمە
دەخیل مەمشۆن لەشم زامە بە خوێنی دڵ كە شۆراوم
لەجێی سێ‌ڕۆژەوو خێرم بڵێن بەو قاتیلەم بەڵكو
بەلای تابووتما بڕوا بڵێ یەك بەستە بۆ باوم
ببەستن موویەكی زوڵفی بە ئەنگوستی شەهادەتمان
لە مەحشەردا تا بزانن بەناحەق من كە كوژراوم . . .
لەباتی خەتم‌و شەو جومعە بڕێژن خاكی بەر رێ‌كەی
بەدەوری قەبرما تاكو بزانم من كە هەرماوم
خودایە سا عەفوم كەی تۆش بەحەقی خۆشەویستی خۆت
شەهیدێكم شەهیدی عەشق وەكو پەروانە سووتاوم
لە تەئریخی هەزارو سێ‌سەدو حەوت‌و چلی هیجری
هەتا ئەم ڕۆژە وا ئەمرم شەریكی قەهرو زوخاوم
بەگریەو ناڵەو شین بە هاوارو بەقوڕ پێوان
ئەوا ڕووم كردە دیوانت موحەممەد (ئەحمەد)ە ناوم



# ئەی فەلەك

ئەی فەلەك توخوا بە ناحەق بەندی زیندانم بەسە
لێم‌گەڕێ ساتێ بژیم با ، بەسیە گریانم بەسە
ئەی فەلەك تاکەی ئەسیری دەستی خۆتم تۆ دەکەی ؟
مەسخەرەی دوژمن حەزینێ ڕوو بێ دۆستانم بەسە
ئەی فەلەك سووچم چی‌یە من ئەخەیە زیندانەوە
تووشی ئەنواعی فەلاکەت بوونو سوتانم بەسە

بەرگەو صەبرو تەحەممول ناگرم هێزم نەما
مەوجی فرمێسکی وەکو خوێن قوڵپی گریانم بەسە
ناوسکت کردم بە خوێناو خۆ جگەر وێنەی کەباب
دووکەڵی ئاهی دەروونم تا بە ئاسمانم بەسە
توخووا بۆچ ئەمکوژی تۆ جوانەمەرگم بۆ ئەکەی
ئاهی مەظلومانەو هاواری طیفلانم بەسە

بەسیەتی لەم حاڵە زیاتر بوو بەشانەی هەنگ دڵم
کونکونوقیمەی جنینی جەرگی بوریانم بەسە
مەمکەرە قوربانی میحنەت وا ئەڵێم سووتانمی
بێ جورمو عوزرو گوناهم حوکمی خنکانم بەسە
بێکەست کردم کە کردت بۆچی تۆ ڕیسوام ئەکەی
گیرەوەی چەن دەردو مەینەت خانە تالانم بەسە
توو خودا وەرگێرە ڕوویەك بەختیارم تۆ بکە ؟
بەحری چەرخت بێتە جەولان تۆزی بارانم بەسە
ئەی خوا لالانەوەی من بەم زوبانی لاڵەوە
ڕوو لە قاپیو دەرگەهی تۆم ڕووتو عوریانم بەسە

رووڕەشی دەرگانەکەی تۆمو سەگێکی (مصطفی)
ملکەچی دێوانەکەی تۆم لوتفو ئەمانم بەسە
بیکە بۆ جاهی (محمد) (ص) خاتمی جەمعی روسول
لەو غەزینەی پڕ لە ڕەحمەت تۆزێ ئیحسانم بەسە
عاشق شۆخێکە (ئەحمەد)بۆیە وا ڕیسوا بووە
یا نەجاتم یا خەلاتی یاری جارانم بەسە

---

# تاك

دڵێکم ئەوێ دڵداریم فێرکا
چاوی چنۆکی پڕ عەشقم تێرکا

---



# شینی پیرەمێرد

١٩٥٠

ئەی فەلەك تاكەی لەدەس تۆ : شینی تۆ گریانی تۆ
تابەكەی نەبڕێتەوە هاواری تۆ . نالآنی تۆ
تابەكەی چاوی بەشاوی قەومی بێكەس ، ئەشكی خوێن . .
هەر بڕێژێ یەك بەدووی یەكدا ، نەدەی ئامانی تۆ
پڕ بڕین ئاهو ئەنین . . . بۆ نەسرەوێ ساتێ دڵی ! !
دایكی لێقەوماوی كوردی بێسەرو سامانی تۆ
دەی وەرە سا پێكەوە با دەستە ئەژنۆ شین بكەین
تۆ بەیادی (پیرەمێرد)و من بە سوێی جوانانی تۆ
پێكەوە بگرین بەیەك دەنگ بانگ بكەینە (پیرەمێرد)
پێی بڵێین ئەی پیری جوان دڵ پێشرەوی جوانانی تۆ
خاڵە : مردی . نامری هەرگیز لەگیانی میللەتا
ناوی تۆ نیشانی تۆ كرداری بێ پایانی تۆ
بووبە نەخشی بەرد لەدڵدا . . .زەحمەتە كوێر بێتەوە
یادگارو رەمزی ناوی (ژین)ی تۆ بۆ (ژیانی) تۆ
تا ئەبەد وێردی زوبانە قەت لەبیر ناچێتەوە
زەمزەمەی شیرین‌و تازەی لاوك‌و حەیرانی تۆ
پەیرەوی دوا ڕۆژە ، حەلقە گوێبە بۆ گەورەو بچووك
پەندی پڕ تەئسیرو مەعنا . پەندی پێشینانی تۆ
هەر لە گردی یاری (یارە)ت مەڵبەنی جوانی و بەهار
باقیەو باق ئەبێ . نەورۆزی تۆ سەیرانی تۆ
زۆر لەمێژە چاوەڕێتە گیانی پاكی مەولەوی
بۆت پەرۆش‌بوو ئاهو ناڵەی (پیرەكەی پیرانی) تۆ

